




م.ی. کامەران عبدالرزاق برایم
مامۆستا لە زانکۆی سەڵاحەددین-هەولێر

# ساڵنامەکانی عوسمانی و بایەخیان بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد

## ساڵنامە چیە؟

ساڵنامە، سەرچاوەیەکی فەرمی عوسمانییە کە لە میانەی چاکسازییەکانی سەردەمی تەنزیماتدا دەستکراوە بە بڵاوکردنەوەیان، زانیاری گرنگیان دەربارەی مێژوو، جوگرافیا، پەروەردە، کولتوور، ئاواکاریی، دۆخی ئابووری، کۆمەڵایەتی، پەیکەری کارگێڕی دەوڵەت...تاد تۆمارکردووە. ناوەکەشی لە هەردوو وشەی فارسی (لە هەمان کاتدا کوردی) (سال) و (نامە) پێکهاتووە.[1] هەندێک جاریش بە (نو سال) ناوبراون، ئەمەشیان هەر وشەیەکی فارسییە و بەمانای ساڵی نوێ دێت.[2] مەبەست لێیان نیشاندانی بارودۆخ و ڕووداوی ساڵێکی ناوچەیەک یان دامەزراوەیەکی تایبەتە لە شێوەی تۆمارێکی فەرمیدا.

بۆ یەکەمجار دەرکەوتنی ساڵنامە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی ١٥ز، کە لە شاری (ڤیەننا) چاپ و بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەردەوام نەبووە. دواتر بەشێوەیەکی بەردەوام لە ناوەڕاستی سەدەی ١٦ز لە ئەڵمانیا لەژێر ناوی (ئەڵماناک) دەرکەوتووە. دوای ئەوان، فەرەنسیی و ئینگلیزەکانیش ساڵنامەیان دەرکردووە و زیاتر پێشیان خستووە. دیارترینیشیان بریتییە لە ساڵنامەی شاهانەی فەرەنسی، کە زیاتر لە دوو سەدە تەمەنی هەبووە، لەگەڵ ساڵنامەی (ئەڵماناک دۆ گۆتا)ی ئەڵمانی کە لە ساڵی ١٧٦٣وە بەشێوەی ساڵانە دەرچووە.[3]

بەپێی سەرچاوەکان دوای ئەوەی لە سەردەمی تەنزیماتدا دەوڵەتی عوسمانی کەوتە ژێر کاریگەریی ئەورووپا، سەدری ئەعزەم (ڕەشید پاشای گەورە) لەژێر کاریگەری ساڵنامە ئەڵمانییەکان، ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لەوەی دەوڵەتی عوسمانیش هەنگاوێکی هاوشێوە بهاوێژێت، بۆ ئەم مەبەستەش سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەمی هانداوە.[4] سەرەنجام لە ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٨٤٦

---

1 Bkz: Mehmet Zeydin Yıldız ve Orhan Deniz, “Maarif Salnamelerine Göre, 19. Yüzyıl Sonunda Van’da Eğitim ve Kültürel Hayat”, Doğu Coğrafya Dergisi, Cilt:21, Sayı:35, Şubat 2016, s. 199 ; İlhan Palalı, XIX. Yüzyılın İkinci Yarısında Diyarbakır 1869-1905, İnönü Üniversitesi, Dokora Tez, Malatya 1999, s. 4.

2 Hasan Duman, Osmanlı Yıllıkları, IRCICA, İstanbul 1982, s.17.

3 Palalı, XIX. Yüzyılın İkinci Yarısında Diyarbakır 1869-1905, s. 4.

٤ مؤيد توفيق العقرباوي، السالنامات العثمانية، نشأتها، وتطورها، وأهميتها في تأريخ العرب الحديث ١٨٤٧–١٩١٧م، مجلة الزرقاء للبحوث والدراسات الإنسانية، المجلد ٢٠، العدد ١، ٢٠٢٠، ص ٩٥.





بڕیاردراوە لە مانگی موحەڕەمی هەموو ساڵێکدا ساڵنامە چاپ و بڵاو بکرێتەوە.[٥] بۆ ئەم مەبەستەش مێژوونووس خەیروڵڵا ئەفەندی کراوەتە بەرپرسی کارەکە. یەکەم ساڵنامەش لەلایەن ئەحمەد وەفیق پاشاوە ئامادە کراوە، کەسایەتی ئەحمەد جەودەت پاشاش ڕۆڵی تێدا هەبووە.[٦] بەمشێوەیە مێژووی ساڵنامە لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەستیپێکردووە، کە لە نێوان ساڵانی ١٨٤٧-١٩٢٢ بۆ ماوەی ٧٥ ساڵ بەردەوام بووە.[٧] بەتێپەڕبوونی کات ساڵنامەکان جۆراوجۆر بوون و بەگشتی بە چوار کاتەگۆری جیاواز دەرچوون، کە بریتین لە: ساڵنامەکانی دەوڵەت، ساڵنامەی وەزارەتەکان، ساڵنامەی ویلایەتەکان و ساڵنامە تایبەتەکان.[٨]

## جۆرەکانی ساڵنامە و گرنگیان بۆ مێژووی کورد

توێژەران ساڵنامەکانیان بۆ چەند جۆرێک پۆلێن کردووە؛ هەندێکیان دابەشیان کردووە بۆ سێ جۆر (ساڵنامە گشتییەکانی دەوڵەت، ساڵنامەی وەزارەتەکان و ساڵنامەی ویلایەتەکان). هەندێکیش بۆ دوو جۆر (ساڵنامەکانی دەوڵەت و ساڵنامە فەرمییەکان) دابەشیان کردووە. بەڵام، بەشێوەیەکی گشتی پۆلێنکردنیان بۆ چوار جۆری: ساڵنامەکانی دەوڵەت، وەزارەتەکان، ویلایەتەکان و تایبەتەکان لەلایەن توێژەرانەوە زیاتر قبوڵکراوە.[٩]

### ١- ساڵنامەکانی دەوڵەت:

ئەمەیان وەک یەکەم وەشانی ساڵنامەکان لەژێر ناونیشانی (سالنامەء دولت علیەء عثمانیە) لە ساڵی ١٢٦٣ک/١٨٤٧ز چاپکراوە. لە سەرەتادا ئامادەکردنی لە ئەستۆی چەند کەسایەتییەکی پلەدار و زانستیی دەوڵەت بووە، بەڵام دواتر لە

5 İlhan Palalı, "Osmanlı Salnameleri ve Tarih Araştırmalarındaki Kaynak Olarak Önemi", Harran Üniversitesi İlahiyat Fakültesi Dergisi, Cilt:23, Sayı:23, Haziran 2010, s. 2.

6 Hayriye Bayazıdoğlu, Salnamelere Göre Beyrut 1893-1908, Gazi Üniversitesi, Yüksek Lisans Tez, Ankara 2010, s. 6 ; Fadime Ceylan, Vilayet Salnamelerinde Yozgat 1873-1907, Afyon Kocatepe Üniversitesi, Yüksek Lisans Tez, Afyonkarahisar 2013, s. 4

7 Duman, Osmanlı Yıllıkları, s.17.

8 Yıldız ve Deniz, Maarif Salnamelerine Göre..., s. 199 ; Filiz Ünal, Maarif Salnamelerine Göre İstanbul'da Eğitim-Öğretim 1898-1903, Gazi Üniversitesi, Yükek Lisans Tez, Ankara 2007, s. 1-2.

٩ العقرباوي، السالنامات العثمانية، ص ٩٥-٩٦.

سالّی ١٨٧٢ خرایە ئەستۆی وەزارەتی مەعاریف، هەروەک لە سالّی ١٨٨٨ بەدواوە لەلایەن (فەرمانگەی تۆماری فەرمانبەران)ەوە ئامادە کراوە.[١٠]

سالّنامەکانی دەولّەتی عەلییە ٦٨ وەشانی لێ دەرچووە، لە سالّی ١٨٤٧ ەوە تا ١٩١٢ بەبێ پچڕان، بەلّام بەهۆی بارودۆخی جەنگی یەکەمی جیهانی و لەدەستدانی خاکێکی زۆری دەولّەتی عوسمانی، بۆ ماوەی پێنج سالّ ڕاگیراوە، پاشان کۆتا وەشانی لە سالّی ١٩١٨ دەرچووە.[١١] لە سەرەتاوە هەتا وەشانی ژمارە ٣٥ی سالّی ١٨٨٠ لە ڕێگەی چاپی بەردین و دواتر لە ڕێگەی چاپخانەی مۆدێرنەوە چاپکراون. سەرەتا بە نرخی شەش قورش فرۆشراون، بۆ ئەو ڕۆژگارە نرخێکی زۆر گران بووە، بەلّام لە وەشانی سێیەمەوە نرخەکەی بۆ پێنج قورش کەم کراوەتەوە.[١٢] وەشانی یەکەم وەک قەبارە بچووکترینی ئەم زنجیرەیە لە ١٦٧ لاپەڕە پێکهاتووە،[١٣] دواتر بەرەبەرە فراوان بووە، بەتایبەتی ئەوانەی لە سەردەمی سولّتان عەبدولحەمیدی دووەم ١٨٧٦-١٩٠٨ دەرچوون قەبارە گەورەن و ڕێکوپێکترین سالّنامەن،[١٤] نزیکی هەزار لاپەڕە و سەرووتریشن. ئەمانە زانیاریی گشتگیر و گرنگیان دەربارەی تەواوی دامودەزگا و ویلایەتەکانی دەولّەت تۆمارکردووە، لەوانەش: مێژووی سولّتانەکانی عوسمانی، دامودەزگاکانی سەلّتەنەت لە پایتەخت و فەرمانبەران، وەزارەتەکان، ویلایەتەکان و فەرمانبەر و پێکهاتە کارگێڕییەکانیان ... تاد. بەجۆرێک کە وێنەیەکی گشتگیر دەربارەی دەولّەتەکە بەخوێنەر دەبەخشن.

گرنگی ئەو سالّنامانە بۆ مێژووی کورد لەوەدایە، لەکاتێکدا دەرچوون و زانیارییان تۆمارکردووە کە هێشتا ویلایەتە کوردنشینەکان هەنگاوی هاوشێوەیان نەناوە. ئەگەر باشووری کوردستان بەنموونە وەربگیرێت، دەبینرێت کە بۆ یەکەمجار لە سالّی ١٨٩١ سالّنامەی ویلایەتی موسلّ تێدا دەرچووە، واتە ٤٤ سالّ

10 Mehmet Zeki Pakalın, Tarih Deyimleri ve Terimleri Sözlüğü, Baskı 2., Milli Eğitim Basımevi, İstanbul, 1972, c. 3., s. 106 ; Palalı, XIX. Yüzyılın İkinci Yarısında Diyarbakır 1869-1905, s. 5 ; Palalı, Osmanlı Salnameleri…, s. 3.

11 Duman, Osmanlı Yıllıkları, s.18 ; Palalı, XIX. Yüzyılın İkinci Yarısında Diyarbakır 1869-1905, s. 5.

12 Duman, Osmanlı Yıllıkları, s.18-19.

١٣ بڕوانە: سالنامەء دولت علیەء عثمانیە ١٢٦٣.

14 Bayazıdoğlu, Salnamelere Göre Beyrut 1893-1908, s. 8 ; Ceylan, Vilayet Salnamelerinde Yozgat 1873-1907, s. 5.

دوای دەرچوونی یەکەم سالنامەی دەوڵەتی عەلییە، بەمەش ئەم سالنامانە دەتوانن ئەو کەلێنە مێژووییە پڕ بکەنەوە کە بەهۆی دواکەوتنی ویلایەتە کوردنشینەکان لە دەرکردنی سالنامەدا دروست بووە. بەگشتی، بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی کوردستانی عوسمانی، پێویستە توێژەر کار لەسەر ئەو زانیارییانە بکات، کە دەربارەی ئەم ١٠ ویلایەتە تۆمارکراون:[١٥]

| | |
|---|---|
| باکووری کوردستان | دیاربەکر، وان، بەدلیس، ئەرزەڕۆم، مەعمورەتولعەزیز و سێواس |
| باشووری کوردیتان | بەغدا و موسڵ |
| ڕۆژئاوای کوردستان | حەلەب و دێرەزور |

بە پشتبەستن بەو سالنامانە دەتوانرێت ناوی والییەکان، موتەسەڕیفەکان، قایمقامەکان، کاربەدەستان و فەرمانبەرانی تر، دامەزراوەکانی دەوڵەت، ژمارەی قوتابخانە و قوتابیان و ناوی وانەکانیان، لە هەمووی گرنگتر دەتوانرێت سنوور و پێکهاتەی کارگێڕی کوردستانی عوسمانی بەوردی دیاری بکرێت.

**٢- سالنامەی وەزارەتەکان:**

دوای سەرکەوتنی ئەزموونی سالنامەکانی دەوڵەتی عەلییە، بڕیاردرا وەزارەتەکانیش هەمان هەنگاو بگرنەبەر، بەمەش وەزارەتەکانی دەوڵەت دەستیان بە دەرکردنی سالنامەی تایبەت بەخۆیان کرد. تیایدا پەیکەری وەزارەت و دامەزراوەکان لە ویلایەتەکان و ناوی فەرمانبەرانیان ڕوون دەکردەوە. ئەم جۆرە سالنامانە لە نێوان سالانی ١٨٦٥-١٩٠٨ پەنجا و یەک وەشانی جیاوازیان لێ دەرچووە. (سالنامەی عەسکەری) پێشەنگی ئەم جۆرەیانە، دوای ئەوە (سالنامەی بەحرییە، سالنامەی خاریجییە، سالنامەی مەعاریفی عوممییە، سالنامەی عیلمیە، سالنامەی ڕەسەتخانەی عامیرە و سالنامەی ڕسومات) وەشانەکانی خۆیان دەرکردووە.[١٦]

---

١٥ بڕوانە: سالنامەء دولت علیەء عثمانیە ١٣٣٣-١٣٣٤ مالیە.

16 Palalı, Osmanlı Salnameleri…, s. 5.

گرنگترینیان بۆ مێژووی کورد بریتییە لە ساڵنامەکانی وەزارەتی مەعاریف کە لە نێوان ساڵانی ١٨٩٨-١٩٠٣ شەش[١٧] وەشانی لێ دەرچووە.[١٨] ئەم ساڵنامانە زانیاری زۆر گرنگیان دەربارەی ڕەوشی خوێندنی دەوڵەت تۆمارکردووە. دەتوانرێت لەڕێگەی ئەمانەوە ژمارە و ناو و جۆری قوتابخانە حکومییەکان(مەدەنی و سەربازی)، قوتابخانەی مسوڵمان و نامسوڵمانەکان، بەرواری دامەزران و ناوی دامەزرێنەر، ناوی مامۆستاکان، بابەتەکانی خوێندن، ژمارەی قوتابیان، ژمارەی کتێب و کتێبخانەکان و چەندین زانیاری تر ڕوون بکرێنەوە.

### ٣- ساڵنامەی ویلایەتەکان:

دوای جێبەجێکردنی نیزامنامەی ویلایەتەکان، یەکێک لەو چاکسازییانەی ئەنجام درا بریتی بوو لە دەرکردنی ساڵنامەی تایبەت بە ویلایەتەکان. یەکەمین وەشانی ئەم جۆرە ساڵنامەیە لە ساڵی ١٨٦٦-١٨٦٧ لەلایەن ویلایەتی (بۆسنا)وە دەرچووە، کۆتا وەشانیش لە ساڵی ١٩٢١-١٩٢٢ لەلایەن ویلایەتی (بۆڵو)وە دەرکراوە. لە هەر ویلایەتێکیشدا (نووسەری ویلایەت) بەرپرس بوو لە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی ناوەڕۆکی ساڵنامە. بەڵام ویلایەتەکان هاوتای یەک نەبوون لە دەرکردنیدا، لەکاتێکدا هەندێکیان بایەخی زۆریان پێداوە و ٣٥ وەشانیان دەرکردووە، هەندێکی دیکە تەنها یەک وەشانیان دەرکردووە.[١٩] هەندێک لە توێژەران باسیان لەوە کردووە کە ژمارەی ساڵنامەی ویلایەتەکان گەیشتووەتە ٢٠٠٠ ساڵنامە،[٢٠] بەڵام ئەم ژمارەیە زیادەڕەوی تێدایە. ئەوەی سەلمێنرابێت ئەوەیە کە بەگشتی ویلایەتەکان ٥٢٧ ساڵنامەی جیاوازیان دەرکردووە.[٢١]

ساڵنامەی ویلایەتەکان باشترین سەرچاوەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی کورد لەبەر ئەم خاڵانە:

---

١٧تا ئێستا تەنها پێنج وەشانی کەوتوەتە بەردەستی توێژەران و وەشانی ساڵی ١٣٢٠ک/١٩٠٢ز نەدۆزراوەتەوە. بڕوانە: Ceylan, Vilayet Salnamelerinde Yozgat ١٨٧٣-١٩٠٧, s. ٦.

18 Yıldız ve Deniz, Maarif Salnamelerine Göre..., s. 199.

19 Palalı, XIX. Yüzyılın İkinci Yarısında Diyarbakır 1869-1905, s. 6-7 ; Palalı, Osmanlı Salnameleri…, s. 6-7.

٢٠ فاضل مهدي بيات، السالنامات العثمانية وأهميتها لتأريخ العراق، مجلة المورد، المجلد ٧١، العدد ٢، ٨٨٩١، ص ٤.

21 Yıldız ve Deniz, Maarif Salnamelerine Göre..., s. 199.





أ- زانیارییەکان لەلایەن دەسەڵاتی ناوچەییەوە ئامادە و تۆمار کراون، بەراورد بە ساڵنامەکانی دیکە درووستر و متمانە پێکراوترن.

ب- بەگشتی زانیارییەکان تایبەتن بە ویلایەتێکی دیاریکراو، لەو چوارچێوەیەشدا زۆرترین وردەکاریی و زانیاری دەربارەی هەر ویلایەت و ناوچە کارگێڕییەکانی لەم ساڵنامانەدا تۆمارکراوە، بەجۆرێک کە لە هیچ ساڵنامەیەکی تردا دەستناکەون. ئەگەر زانیاریی و داتای وەشانە جیاوازەکان بەراورد و شرۆڤە بکرێن، دەتوانرێت زانیاری زۆر گرنگ و نوێ بخرێتەڕوو.

ت- ئەم ساڵنامانە وێنەیەکی گشتگیر و تێروتەسەل دەربارەی پێکهاتەی کارگێڕی مەدەنیی و سەربازی، ناوی فەرمانبەران و پلەکانیان، مێژوو، جوگرافیا، ژمارەی دانیشتوان، چالاکییە ئابوورییەکان، داهات و خەرجیەکان، کشتوکاڵ و پیشەگەری، بەروبومەکان، ڕەوشی خوێندن، ڕەوشت و دابونەریتە باوەکانی خەڵک، ئایینەکان، داتای جۆراوجۆر، لەگەڵ چەندین زانیاری تر دەربارەی ویلایەت و سەنجەق و قەزا و ناحیەکان دەخەنە بەردەستی توێژەران.

پ- بە بۆچوونی د.موئەیەد عەقرەباوی ئەمانە سەرچاوەیەکی زۆرباشن بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی سنوور، بەوپێیەی سنووری کارگێڕی ویلایەت و ناوچەکان زۆر بەوردی دیاریکراون.[٢٢]

**گرنگی ئەو ساڵنامانە بۆ مێژووی کورد لەوەدایە، لەکاتێکدا دەرچوون و زانیارییان تۆمارکردووە کە هێشتا ویلایەتە کوردنشینەکان هەنگاوی هاوشێوەیان نەناوە.**

٢٢ العقرباوي، السالنامات العثمانية، ص ١٠١.

له ویلایەتە کوردنشینەکان، یاخود ئەو ویلایەتانەی کە بەشێکی کوردنشین بوون، تەنها هەشت دانەیان ساڵنامەیان دەرکردووە. یەکەم وەشانیش لەلایەن ویلایەتی دیاربەکرەوە لە ساڵی ١٨٦٩ دەرکراوە، کۆتاهەمینیشیان لە ساڵی ١٩١٢ لەلایەن ویلایەتی موسڵەوە دەرکراوە. بەپێی سەرژمێرییەک کە توێژەر ئەنجامی داوە، وەک لەو خشتەی خوارەوەدا دەردەکەوێت، ١٢٠ وەشانی جیاوازی ئەم ساڵنامانە بەردەستن، کە توێژەران بۆ ڕوونکردنەوەی بارودۆخی کوردستانی عوسمانی دەتوانن کاری لەسەر بکەن.

| ویلایەت | وەشانی ساڵنامە/ دانە | ماوەی دەرچوون لە نێوان ساڵانی |
|---|---|---|
| ئەرزەڕۆم | ١٥ | ١٩٠٠-١٨٧٠ |
| بەدلیس | ٤ | ١٩٠٠-١٨٩٢ |
| دیاربەکر | ٢٠ | ١٩٠٥-١٨٦٩ |
| | ٨ | ١٩٠٧-١٨٨٤ |
| سێواس | ١٣ | ١٩٠٧-١٨٧٠ |
| بەغدا | ٢٠ | ١٩١١-١٨٧٥ |
| موسڵ | ٥ | ١٩١٢-١٨٩١ |
| حەلەب | ٣٥ | ١٩٠٨-١٨٧٦ |

### ٤- ساڵنامە تایبەتەکان:

هەندێکیان لەلایەن دامەزراوەکانی دەوڵەت و هەندێکی دیکەش لەلایەن کەسایەتییەکانەوە دەرکراون. بەپێچەوانەی ئەوانەی پێشوو، ئەمانە بە ساڵنامەی نافەرمی هەژمار دەکرێن. یەکەمینی ئەم جۆرەش لە ساڵی ١٨٧١ لەلایەن عەلی سواڤی لە پاریس دەرکراوە بەناونیشانی (تورکیا لە ساڵی ١٢٨٨)، لەم ساڵنامەیەدا باسی جوگرافیا، دانیشتووان، کشتوکاڵ، پیشەسازی، ڕێگای وشکانی و دەریایی، کەشتی بازرگانی، بەندەرەکان و بەهاکانی دراوی دەوڵەتی عوسمانی کراوە.[٢٣] پاشان چەندین ساڵنامەی تری تایبەت دەرچوون، بەتایبەتی کەسایەتی ئەبو زیا محەمەد تۆفیق م١٩١٣ ڕۆڵێکی باڵای هەبووە لەو بوارەدا کە ١٦ ساڵنامەی

23 Palalı, Osmanlı Salnameleri…, s. 9-10.

جیاوازی دەرکردووە، گرنگترینیان بریتین لە : ساڵنامەی حەدیقە، ساڵنامەی ئەبو زیا، نەوساڵی مەعریفەت ... تاد.[٢٤]

بەشێک لەو ساڵنامانە لەژێر ناوی (نەوسال) لەلایەن ڕۆژنامەنووسانەوە دەرکراون، وەک (نوسال ثروت فنون) کە لە نێوان ساڵانی ١٨٩٢-١٨٩٦ پێنج وەشانی لی دەرچووە، پاشان وەستاوە و لە ساڵانی ١٩١٠ و ١٩١١ دوو وەشانی تری دەرچووە.[٢٥] جگە لەمانەش کۆمەڵێک ساڵنامەی تری تایبەت هەن، هەندێک لەوانە لەلایەن هاوڵاتیانی بیانی نیشتەجێ لە دەوڵەتی عوسمانی بە زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسیی و عەرەبیی و ئەرمەنی دەرکراون و مۆڵەتیان پێ دراوە.[٢٦] هەرچەندە ئەم ساڵنامانە هەندێک زانیاری پوخت و کورتیان دەربارەی ناوچەکانی کوردستان تێدابێت، بەڵام زیاتر بۆ خستنەڕووی وێنەیەکی گشتگیر دەربارەی دەوڵەتی عوسمانی نووسراون و وردەکاری زۆر ناگرنەخۆ.

بەشێوەیەکی گشتی، ساڵنامە فەرمیی و تایبەتەکان لە دوای ساڵی ١٨٧٥وە خرانە ژێر چاودێری توندوتۆڵی دەوڵەت، ڕێگا نەدراوە هەرکەس چۆنی بوێت ساڵنامەیەک بڵاوبکاتەوە،[٢٧] بەڵکو پێویست بووە مۆڵەت وەربگرێت و بە پاڵێوی دەوڵەتیشدا تێپەڕێت.[٢٨]

### چۆن دەستمان بە ساڵنامەکان بگات؟

بەشێک لە کتێبخانە گشتیەکانی وڵاتی تورکیا سەرجەم ژمارە و وەشانی ساڵنامەکانیان پاراستووە، لەوانەش ١٢ کتێبخانەی گشتی لە شاری ئیستەنبوڵ.[٢٩] سەرباری گرنگی زۆری ئەم سەرچاوەیە بۆ مێژووی کورد، بەداخەوە کە تا ئێستا کۆلێکشنی وەشانەکان، یان بەلایەنی کەمەوە ئەوانەی پەیوەستن بە مێژووی کورد، لە هیچ کتێبخانەیەکی کوردی بەرچاو ناکەون. بەڵکو زۆربەی مێژووناس

---

24 Pakalın, Tarih Deyimleri ve Terimleri Sözlüğü, c. 3., s. 106

25 Palalı, Osmanlı Salnameleri…, s. 10.

26 BOA: MF.MKT., G:970, D:12 ; BOA: MF.MKT., G:1044, D:44 ; BOA: MF.MKT., G:1016, D:23 ; BOA: MF.MKT., G:604, D:22.

27 Palalı, Osmanlı Salnameleri…, s. 11.

28 BOA: MF.MKT., G:944, D:52.

٢٩ بڕوانە: العقرباوي، السالنامات العثمانية، ص ١٠٠.

و توێژەرانی کورد لە هەرێمی کوردستان کە کاریان لەسەر ساڵنامەکان کردووە، جگە لە پێنج وەشانەکەی ویلایەتی موسڵ و چەند دانەیەکی تری کەم، ساڵنامەکانی تریان نەبینیوە.

جێگای خۆشحاڵییە کە ئێستا (ناوەندی لێکۆڵینەوەی ئیسلام)ی سەر بە (وەقفی دیانەتی تورکیا) سەرجەم وەشانی ساڵنامەکانی بەشێوەی ئەلیکترۆنی بەردەست کردووە و توێژەران دەتوانن دەستیان پێی بگات.

## گرفتی ساڵنامەکان

هەرچەندە ساڵنامەکان سەرچاوەیەکی بایەخدار و ڕەسەنن بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی کورد، بەڵام هەندێک گرفت و هەڵە هەن پێویستە توێژەران ئاگاداری بن و بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ زانیاریی و داتاکانی بکەن. بە بۆچوون و ئەزموونی توێژەر لەگەڵ ساڵنامەکان دیارترین گرفتەکان ئەمانەن:

-1 زمان: ساڵنامەکان بە زمانی تورکی عوسمانی نووسراون و پڕاوپڕن لە دەستەواژە و زاراوەی مێژوویی، پێویستە توێژەر هەم زمانی تورکی عوسمانی بە باشی بزانێت و هەم ئاگاداری مانای دەستەواژەکان بێت، بۆئەوەی بە دروستی بەکاریان بهێنێت. بۆ نموونە زۆرینەی توێژەرانی هەرێمی کوردستان کە ساڵنامەیان بەکارهێناوە، لەژێر کاریگەری زمانی عەرەبیدا وشەی (نائیب)یان بە (جێگری قایمقام یان موتەسەڕیف) وەرگێڕاوە. لەکاتێکدا (نائیب) پلەیەکی سەربەخۆ بووە لە سیستەمی کارگێڕی عوسمانیدا و سەرپەرشتی کاروباری دادوەریی کردووە.

-2 زانیاری دووبارە: هەندێجار ئامادەکارانی ساڵنامەکان نەیانتوانیوە داتا و سەرژمێری نوێ بەدەست بهێنن، بۆیە هەڵساون بە دووبارە دانانەوەی داتای ساڵنامەی پێشووتر. بۆ نموونە هەرسێ ساڵنامەی ١٨٩٤ و ١٨٩٧ و ١٩١٢ی ویلایەتی موسڵ دەربارەی ژمارەی ماڵەکانی شاری سلێمانی دەڵێن لە (٢٩٨٢) ماڵ پێکهاتووە،[٣٠] لەکاتێکدا ماوەی چەندین ساڵ لە نێوانیاندا هەیە و گومانیش لەوەدا نییە کە لەو ماوەیەدا گۆڕانکاری ڕوویداوە. لەوەش زیاتر، هەردوو وەشانی ساڵنامەی ١٨٩١ و ١٨٩٢ی ویلایەتی موسڵ نزیکەی بەتەواوی کۆپی یەکترن و

---

٣٠ بڕوانە: موصل ولایتی سالنامەسی ١٣١٢، ل ٣٢٥ ؛ موصل ولایتی سالنامەسی ١٣٢٥، ل ٢٢٧ ؛ موصل ولایتی سالنامەسی ١٣٣٠، ل ٣٠٠.

جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نییە.[٣١]

-3 زانیاری هەڵە: بە دوو شێواز بەرچاو دەکەوێت، یەکەمیان تۆمارکردنی ناوەکان بەهەڵە، بەتایبەتی ئەو ناوانەی کە تورکی نین. بەهۆی ئەوەی فەرمانبەری نووسەر تورک بووە، ناوەکانی بەشێوەی گۆکردنی خۆی تۆمارکردووە. دووەمیان داتای هەڵە، جا هەڵەی ڕێنووسی بێت یان زانیاری، بۆ نموونە هەردوو ساڵنامەی ١٨٩١ و ١٨٩٤ ژمارەی قاوەخانەکانی شاری موسڵیان بە ٤٥ قاوەخانە دیاری کردووە، کەچی ساڵنامەی ١٨٩٢ نوسیویەتی ١٤٥ قاوەخانە.[٣٢] لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە بەهەڵەی ڕێنووسی ژمارە ١ لە پێش ٤٥ دانراوە. هەڵەی لەم شێوەیەش لە ساڵنامەکاندا زۆرە، پێویستە توێژەر پشت نەبەستێ بە یەک لاپەڕە و یەک ساڵنامە، بەڵکو خوێندنەوەیەکی گشتگیر بکات و داتا و زانیاری وەشانە جیاوازەکان بەراورد بکات.

-4 تێکەڵی و ناڕوونی: هەندێجار زانیاریی و داتای گشتی ویلایەتێک لەگەڵ ناوەندی ویلایەتەکە بە تێکەڵی و ناڕوونی نووسراوە. بۆ نموونە دەربارەی ویلایەتی موسڵ و شاری موسڵی ناوەندی ویلایەتەکە، لە هەندێ شوێن لەویان بۆ ئەویان پەڕیوەتەوە بێ ئەوەی ئاماژەی پێ کرابێت، بەمەش سەر لە توێژەر تێکدەدات و نازانرێت زانیاریی و داتاکە هی کامەیانە، مەگەر دوای وردبونەوە و بەراوردێکی زۆر ورد.

نمونەیەکی تر ئەوەیە، هەندێجار ناوی کۆمەڵێک قەزا و ناحیە بەیەکەوە تۆمارکراون بێ ئەوەی پلە و ناوەندە باڵاکەیان ڕوونکرابێتەوە. لە ساڵنامەی ١٨٥٠ی دەوڵەتی عەلییەدا ناوی ٣٨ شوێنی سەر بە لیوای سلێمانی تۆمارکراوە بێ ئەوەی پۆلێن کرابن.[٣٣] هاوشێوەی ئەم نموونانە، زۆر هەڵەی تر لە ساڵنامەکاندا هەن کە لەسەر توێژەر پێویست دەکەن بەراورد و شرۆڤەکاری ورد ئەنجامبدات بۆ گەیشتن بە ئەنجامی دروست.

---

٣١ بڕوانە: موصل ولایتی سالنامەسی ٨٠٣١ ؛ موصل ولایتی سالنامەسی ٠١٣١.

٣٢ بڕوانە: موصل ٨٠٣١، ل ٧٩ ؛ موصل ٠١٣١، ل ٩٣١ ؛ موصل ٢١٣١، ل ٢٦٢.

٣٣ سالنامەء دولت علیەء عثمانیە ٦٦٢١، ل ٧٨–٨٨.

## سەرچاوەکان


- بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی عوسمانی:

- Maarif Nezareti, Mektubi Kalemi

1- BOA: MF.MKT., G:604, D:22.

2- BOA: MF.MKT., G:944, D:52.

3- BOA: MF.MKT., G:970, D:12.

4- BOA: MF.MKT., G:1016, D:23.

5- BOA: MF.MKT., G:1044, D:44.

- عوسمانییەکان:

١- سالنامەء دولت عليەء عثمانيە ١٢٦٣.

٢- سالنامەء دولت عليەء عثمانيە ١٢٦٦.

٣- سالنامەء دولت عليەء عثمانيە ١٣٣٣-١٣٣٤ ماليە.

٤- موصل ولايتی سالنامەسی ١٣٠٨.

٥- موصل ولايتی سالنامەسی ١٣١٠.

٦- موصل ولايتی سالنامەسی ١٣١٢.

٧- موصل ولايتی سالنامەسی ١٣٢٥.

٨- موصل ولايتی سالنامەسی ١٣٣٠.

- تورکی:

1- İlhan **Palalı**, “Osmanlı Salnameleri ve Tarih Araştırmalarındaki Kaynak Olarak Önemi”, Harran Üniversitesi İlahiyat Fakültesi Dergisi, Cilt:23, Sayı:23, Haziran 2010, s. 1-13 .

2- İlhan **Palalı**, XIX. Yüzyılın İkinci Yarısında Diyarbakır 1869-1905, İnönü Üniversitesi, Dokora Tez, Malatya 1999.

3- Mehmet Zeki **Pakalın**, Tarih Deyimleri ve Terimleri Sözlüğü, Baskı 2.,






Milli Eğitim Basımevi, İstanbul, 1972, c. 3.

4- Mehmet Zeydin **Yıldız** ve Orhan **Deniz**, “Maarif Salnamelerine Göre, 19. Yüzyıl Sonunda Van’da Eğitim ve Kültürel Hayat”, Doğu Coğrafya Dergisi, Cilt:21, Sayı:35, Şubat 2016, 197-208.

5- Filiz **Ünal**, Maarif Salnamelerine Göre İstanbul’da Eğitim-Öğretim 1898-1903, Gazi Üniversitesi, Yükek Lisans Tez, Ankara 2007.

6- Hayriye **Bayazıdoğlu**, Salnamelere Göre Beyrut 1893-1908, Gazi Üniversitesi, Yüksek Lisans Tez, Ankara 2010.

7- Fadime **Ceylan**, Vilayet Salnamelerinde Yozgat 1873-1907, Afyon Kocatepe Üniversitesi, Yüksek Lisans Tez, Afyonkarahisar 2013.

8- Hasan **Duman**, Osmanlı Yıllıkları, IRCICA, İstanbul 1982.

- عەرەبی

٩- مؤيد توفيق العقرباوي، السالنامات العثمانية، نشأتها، وتطورها، وأهميتها في تأريخ العرب الحديث ١٨٤٧-١٩١٧م، مجلة الزرقاء للبحوث والدراسات الإنسانية، المجلد ٢٠، العدد ١، ٢٠٢٠، ص٩٢-١٠٧.

١٠- فاضل مهدي بيات، السالنامات العثمانية وأهميتها لتأريخ العراق، مجلة المورد، المجلد ١٧، العدد ٢، ١٩٨٨، ص٤.